# وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ




لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی مەحوی لە هەولێر

مندالان وەرن . . .

# با فێری ئادابە ئیسلامییەکان ببین

نوسینی

عمر عبدالرحمن

وەرگێڕانی

زانا کریم

2013

ناوی کتێب: منداڵان وەرن . . . با فێری ئادابە ئیسلامییەکان ببین
نووسینی: عومەر عبدالرحمن
وەرگێڕانی: زانا کەریم
تیراژ: ١٠٠٠
چاپخانە: چاپخانەی گوڵ
ژمارەی سپاردن: ١٥٢٩ی ساڵی ٢٠١١ی پێدراوە .
لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی مەحوی – هەولێر – بازاڕی ڕۆشنبیری

# ئادابی نوستن



١ ـ هەوڵ دەدەم لە پاش نوێژی عیشا بخەوم، مەگەر کاتێ نەبێت خەریکی زانست بم، یان لە لای میوان دابنیشم.

٢ ـ هەوڵ دەدەم هەموو شەوێك بە دەستنوێژەوە بخەوم .

٣ ـ لەسەر لای ڕاستەم دەخەوم و نەك لەسەر سك و پشت .

٤ ـ پێش ئەوەی بخەوم ((اية الكرسي)) و سورەتەکانی ((قل هو الله أحد)) و ((قل أعوذ برب الفلق)) و ((قل أعوذ برب الناس)) دەخوێنم، پاشان دوعا دەکەم و دەڵێم ((باسمك اللهم أموتُ وأحيا)) البخاري ومسلم.

واتە: بەناوی تۆوە پەروەردگارا دەمرم و دەژیم.

پاشان سێ جاریش دەڵێم(اللهم قنى عذابك يوم تبعث عبادك)أبوداود والترمذي

واتە: پەروەردگارا پارێزگارم بکە لە سزای ئەو ڕۆژەی کە تێیدا بەندەکانت زیندودەکەیتەوە.

٥ ـ کاتێکیش بەخەبەرهاتم سوپاسی خوا دەکەم و دەڵێم ((الحمدلله الذى أحيانا بعد ما أماتنا وإليه النشور))البخاري ومسلم.

# ئادابی سەر ئاو



١ ـ بەقاچی چەپ دەچمە ژوورەوەو دەڵێم (اللهم إنی أعوذ بك من الخبث والخبائث) البخاری ومسلم.

واتە: پەروەردگارا پەنات پێدەگرم (لە خراپە و پیسی) شەیتانە نێرو مێکان.

٢ ـ ئەگەر شتێکم پێبوو ناوی خودای تێیابوو لەگەڵ خۆم نایبەمە ژورەوە.

٣ ـ بە چاکی دەورو بەرم پۆشتە دەکەم و ناهێڵم کەس چاوی لێم بێت.

٤ ـ هەرگیز لەسەر ئاودا وەڵامی بانگ نادەمە وە و قسە ناکەم، مەگەر زۆر پێویست بێت.

٥ ـ هەرگیز بە پێوە میز ناکەم و ئاو سەر ئاوەکە زۆر بە پاکو خاوێنی ڕادەگرم و پیسی ناکەم.

٦ ـ زۆر بەچاکی و بە دەستی چەپ خۆم پاك دەکەمەوە.

٧ ـ کاتێکیش هاتمە دەرەوە بە قاچی ڕاست دێمە دەرەوەو، دەڵێم (غفرانك)أبوداود وابن ماجه. واتە: پەروەردگارا لێم ببوورە.

٨ ـ پاشان بەر لەوەی دەست بۆ هیچ بەرم دەستەکانم زۆر بەچاکی بەسابوون دەشۆم.

# ئادابی نان خواردن



١ ـ پێش نانخواردن دەستەکانم بە چاکی دەشۆم.

٢ ـ بە نیازی بەندایەتی و کاری خێرو چاکە نان دەخۆم نەك خۆ قەڵە وکردن.

٣ ـ هەرگیز گاڵتە بە هیچ خواردنێك ناکەم و هەرچیم بۆ دابنرێت ڕازی دەبم، لە پێش خۆمەوەو بە دەستی ڕاست دەخۆم ودەست بۆ ئەمسەرو ئەو سەر درێژ ناکەم.

٤ ـ بە ناوی خواوە دەست پێدەکەم و دەڵێم (بسم الله) ئەگەر بیریشم چوو لەسەرەتاوە وا بلێم ئەوا هەر کات هاتەوە بیرم دەڵێم(بسم الله في أوله وآخره) أبو داود والترمذي. واتە: بە ناوی خواوە لەسەرەتاو کۆتاییدا.

٥ ـ بەپەلە ناخۆم و تیکەکان بە چاکی دەجاوم و زۆریش ناخۆم کە نارەحەت ببم.

٦ ـ هەناسەو فو بەسەر خواردنی گەرمدا ناکەم و کارێکی واناکەم ئەوانەی لەگەڵمدان قێزم لێبکەنەوە.

٧ ـ ئەگەر هەر شتێکیشم خواردەوە بەیەك قوم نایخۆمەوە، بەڵکو بە سێ جار دەیخۆمەوەو لەسەرەتادا (بسم الله) دەکەم، ئەگە تەواویش بووم دەڵێم(الحمد الله).

٨ ـ کاتێکیش لەنان خواردن تەواو بوم دەڵێم(الحمد لله الذی أطعمني هذا ورزقنيه من غير حول مني ولاقوة) أبوداود الترميذی. واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی بەبێ هەوڵ تێکۆشانی خۆم ئەم خواردن ڕۆزییەی پێبەخشیم.

# ئادابی ڕێکردن



١ ـ زۆر بەجوانی و ڕێکو پێکی بەڕێگادا دەڕۆم .

٢ ـ بەسەر خەڵکیدا خۆم گە ورە ناکەم وفیزو دەماریان بەرامبەر نانوێنم .

٣ ـ هەرکەسێکم پێگەیشت بە چاکی ڕێزی لێدەگرم و سڵاوی پێشکەش دەکەم.

٤ ـ ئەگەر کەسێکی ناشارەزام توش بوو ئەوا بەچاکی شوێنی مەبەستی پێنیشان دەدەم و شارەزای دەکەم.

٥ ـ خۆم دەپارێزم لەئاوڕ دانەوەی زۆر بەملاولاداو چاوم دەپارێزم لەو شتانەی کە نابێت سەیریان بکەم .

٦ ـ هەرگیز نابە مایەی عەزێت و ئازار بۆ خەڵکی و هەرشتێکی ئازاردەرم بینی لەسەر ڕێگەدا ئە وا دووری دەخەمەوە.

٧ ـ هەکەسێك پێویستی بەمن بوو زۆر بەچاکی یارمەتی دەدەم .

٨ ـ لەبەرامبەر دیمەنە جوانەکاندا دەستخۆشی دەکەم و لەبەرامبەر دیمەنە خراپەکانیشدا ئامۆژگاری.

# ئادابی گەشت کردن



١ ـ کاتێ ویستم سواربم ناوی خوا دەهێنم و دەڵێم (بسم الله)، پاش دانیشتن سوپاسی خوا دەکەم و دەڵێم (الحمدلله)، پاشان دوعای سەفەر دەخوێنم (سبحان الذی سخر لنا هذا وما كنا له مقرنين وإنا إلى ربنا لمنقلبون، الحمدلله، الحمدلله، الحمدلله، الله أكبر، ألله أكبر، ألله أكبر، سبحانك اللهم إني ظلمت نفسي فاغفر لي فإنه لا يغفر الذنوب إلا أنت) أبو داود والترمذي.

٢ ـ زۆر پارێزگاری دەکەم لە پاك و خاوێنی و نابمە مایەی پۆخڵی و تفو بەڵغەم و کاغەز بلاّو ناکەمەوەو فرێشی نادمە دەرەوە.

٣ ـ بەچاکی و بەئەدەبەوە دادەنیشم و نابمە هۆی عەزیەت و ئازاری خەڵکی .

٤ ـ هەرگیز دەستم یان سەرم لە جامی سەیارەوە دەرناهێنم و دڵی نەفەرەکان لە خۆم ناڕەنجێنم.

٥ ـ ئەگەر کەسێکی لە خۆم گەورەتر شوێنی نەبوو دابنیشێ ئەوا شوێنەکەی خۆمی بۆ چۆڵ دەکەم و ڕیزی لێدەگرم.

٦ ـ ئەگر سواربووم بە دەنگێکی نەرم و گونجاو سلاّو لە دانیشتوان دەکەم.

٧ ـ لەکاتی ڕۆیشتنی سەیارەکەداهەوڵی دابەزین نادەم بەڵکوچاوەرێ دەکەم تابەتەوای ڕادەوەستێ و شۆفێرەکە مۆڵە تی دەبەزینم پێدەدات.

# ئادابی جل پۆشین

١ ـ منی کوڕ جل و بەرگی کچان ناپۆشم، هەروەکو دەبێ کچانیش جل و بەرگی کوڕان نەپۆشن.



٢ ـ لە کاتی جل پۆشیندا دەست و قاچ و لای ڕاستم پێشدەخەم.

٣ ـ کاتێ بەرگێکی نوێم پۆشی دوعا دەکەم و دەڵێم(اللهم لك الحمد أنت كسوتنيه،أسألك من خيره وخيرماصنع له، وأعوذبك من شره وشره ماصنع له)أبوداود والترمذي. واتە: پەروەردگارا سوپاس بۆ تۆ، هەر تۆ منت پۆشتە کرد، داوای خێری ئەم بەرگەت لێدەکەم و ئەوەی بۆی دروست کراوە، وەپەنات پێدەگرم لەخراپەی ئەم بەرگەو ئەوەی بۆی دروستکراوە.

٤ ـ بەلاّم ئەگەر بەرگەکە نوێ نەبوو ئەوا دوای لە بەرکردنی دەڵێم( الحمد لله الذي كساني هذا ورزقنيه من غير حول مني ولا قوة) أبوداود.

واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی پۆشتەی کردم و ئەم پۆشاکەی پێبەخشیم بەبێ هیچ هەوڵ و تێکۆشانێکی خۆم.

٥ ـ ئەگەر کەسێکم بینی جلی تازەی پۆشیبوو پێی دەڵێم(البس جديدا، وعيش حميدا، ومت شهيدا)ابن ماجه. واتە: بپۆشە جلی تازە، یاخوا بەخۆشی و سوپاسەوە بژیت و بەر پلەی شەهیدی بکەویت.

٦ ـ کاتێ ویستم جل دابکەنم ناوی خوا دەبەم و دەڵێم (بسم الله) الطبراني .

٧ ـ منی کوڕ هەرگیز ئاڵتون و ئاوریشم ناپۆشم، چونکە ئاڵتون و ئاوریشم پۆشین تەنها بۆ کچان دروستە.

# ئادابی ڕۆیشتن و گەڕانەوە



١ ـ کاتێ لەماڵ دەرچووم بەقاچی چەپ دەڕۆمە دەردوەو دەڵێم (بسم الله، توكلت على الله، ولا حول ولا قوة إلا بالله). واتە: بەناوی خوا، پشتم بە خوا بەستووەو، هیچ هێزو گوڕانێکیش نییە مەگەر بەهۆی خوداوە نەبێ.

٢ ـ کاتێکیش گەڕامەوە بەقاچی ڕاست دەڕۆمە ژوردوەو دەڵێم(بسم الله ولجنا وبسم الله خرجنا وعلى ربنا توكلنا) واتە: بەناو خواوە دەچینە ژووردوەو هەر بەناوی ئەویشەوە دەرچووین و هەموو کاتیش هەر پشت بەو دەبەستین.

٣ ـ پاش ئەوەی چوومە ژووردوە سلاو دەکەم و دەڵێم (السلام عليكم ورحمة الله وبركاته).

# ئادابی سلاو کردن



١ ـ هەرکاتێ ڕووبەروو بوومەوە لەگەل موسولمانێکدا ئەوا سلاوی خوای پێشکەش دەکەم و پێی دەلێم (السلام علیکم ورحمة الله وبرکاته) پێویستە ئەویش وەلامم بداتەوەو بلێ (وعلیکم السلام ورحمة الله وبرکاته)

٢ ـ دەبێت بزانین مرۆڤی سواری دەبێ سلاو لە خەلکانی پیادە بکات،وە دەبێت پیادەش سلاو لە دانیشتوو بکات، وە دەبێ خەلکێکی کەم یەکەم جار سلاو بکەن لە خەلکیکێی زۆر، وە ئێمەی مندالیش ددبێ یەکەمجار سلاو بکەین لە گەورەکان.

٣ ـ هەرگیز کەم تەرخەم و ساردو سڕ نابم لەبەرامبەر ئەو کەسانەدا کە سلاوم لێدەکەن، بەلکو زۆر ڕێزیان لێدەگرم و بەجوانترین شێوە وەلامیان دەدەمەوە.

# ئادابی مۆڵەت وەرگرتن



١- هەرگیز بە بێ مۆڵەت خۆم ناکەم بە ماڵی هیچ کەسێکدا.

٢- بەشێوەیەکی جوان و لەسەرخۆ لە دەرگا دەدەم تا سێ جار و لە نێوان جارێك بۆ جارێکی تردا کەمێك چاوەڕوان دەبم، ئەگەر لێیان نەکردمەوە ئیتر دەڕۆم

٣- ئەگەر خاوەن ماڵەکە ووتی کێیە؟ ناڵێم منم! بەڵکو ناوی خۆم دەڵێم.

٤- کاتێ مۆڵەتی چوونە ژوورەوەیان پێداین سلاو دەکەین و چاومان لە نهێنیەکانیان دەپارێزین

٥- لە ماڵی خۆیشمان لە دوای نوێژی نیوەڕۆ و دوای نوێژی عیشا و پێش نوێژی بەیانی بەبێ مۆڵەت ناچمە لای دایك و باوکم.

# ئادابی چوونە مزگەوت



١- بە قاچی ڕاست دەچمە ژوورەوە و دەڵێم (بسم الله والصلاه والسلام علی رسول الله، اللهم افتح لی أبواب رحمتك). ابن النسي و ابوداود و مسلم . واتە: بەناوی خوا، درووود و سڵاوی خوا لەسەر پێغەمبەر (د.خ) ، پەروەردگارا دەرگاکانی سۆز و بەزەیتم لێ بکەرەوە.

٢- دانانیشم تاوەکو دوو ڕکات نوێژ نەکەم.

٣- قسەی بێ سوود ناکەم، ئەگەر قسەشم کرد زۆر بە هێمنی یەود قسە دەکەم.

٤- خۆم بە یادی خواوە خەریك دەکەم و هەرگیزبە بەردەمی نوێژ خوێنەکاندا ناڕۆم و هەنگاو بەسەر شانیاندا هەڵناهێنم.

٥- کڕین و فرۆشتن لەناو مزگەوتدا ناکەم و زۆر گرنگی دەدەم بە پاك و خاوێنی مزگەوت.

٦- کاتێکیش ویستم بێمە دەرەوە قاچی چەپم پێش دەخەم و دەڵێم (بسم الله والصلاة والسلام علی رسول الله، اللهم إني أسألك من فضلك). ابن ماجه

واتە: بەناوی خوا درروود و سڵاوی خوا لە سە پێغەمبەر(د.خ)، پەروەردگارا دەرگاکانی بەخششی خۆتم لێ بکەردوە.

# ئادابی کۆڕ و مەجلیس



١- پێش ئەوەی دانیشم سلاو لە دانیشتوان دەکەم.

٢- بەبێ مۆڵەت لە نێوان دوو کەسدا دانانیشم، وە هەرگیز کەسێك لە شوێنێکدا هەڵناسێنم تا خۆم لە شوێنەکەیدا دابنیشم.

٣- لە ناوەڕاستی مەجلیسدا دانانیشم، بەڵکو دەچمە ڕیزەوە، زۆر بە لەسەر خۆیی دادەنیشم، ئەگەر کەسێکی تریش هات شوێنی بۆ فراوان دەکەم تاوەکو دابنیشێ.

٤- خۆم سە رقاڵ ناکەم بە پەنجە تەقاندن و لووت پاکردنەوە و خۆ خوراندنەوە، وە هەوڵ دەدەم باوێشکیش نەدەم،ئەگەر داشم دەست لەسەر دەمم دادەنێم

٥- ئەگەر کەسێك قسەی کرد گوێی بۆ ڕادەگرم و قسەکەی پێ نابڕم تا تەواو دەبێت.

٦- کاتێکیش هەستام و ویستم بڕۆم دەڵێم(سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا إله إلا أنت أستغفرك وأتوب إليك).

واتە: پاك و بێگەردی و سوپاس وستایش بۆ تۆ ئەی پەروەردگارا، شاهێدی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نیە تەنها زاتی تۆ نەبێت، داوای لێخۆشبوونت لێدەکەم و دەگەڕێمەوە بۆ لات.

# ئادابی نەخۆش و سەردانیکردنی نەخۆش



١- هەرکاتێ هەستم بە ئێش و ئازارێك کرد لە لاشەمدا دەستی دەخەمە سەر و سێ جار دەڵێم (بسم الله) پاشان حەوت جار دەڵێم (أعوذ بعزة الله و قدرته من شر ما أجد وأحاذر)واتە: پەنا دەگرم بە خوای گەورە و قودرەت و توانای لە خراپەی ئەو ئازارەی هەستی پێدەکەم و سڵی لێ ئەکەمەوە.

٢- ڕازی دەبم بە قەدەرەکانی خوداوند و لەبەرامبەریاندا بێزاری دەرنابڕم و هەموو کات هانا بۆ خوا دەبەم، ئەگەر کەسێکیش پرسیاری حاڵمی کرد لە وەڵامدا پێی دەڵێم (الحمد لله).

٣- ئەگەر سەردانی موسوڵمانێکی نەخۆشم کرد ئەوە دەچمە لایەوە و حەوت جار دەڵێم (أسأل الله العضيم رب العرش العضيم أن يشفيك) الترمذي و ابوداود.

واتە: داوا ئەکەم لە خوای مەزنی خاوەنی عەرشی مەزن کە شیفات بدات.

٤- لە لای نەخۆش زۆر دانانیشم تاوەکو ناڕەحەت نەبێت، مەگەر کاتێ نەبێ کە بە دانیشتنم خۆشحاڵ بێ.

٥- هەرگیز نەخۆش ناترسێنم، بەڵکو مژدەی چاك بونەوە و ئامۆژگاری ئارام گرتن و سەبر گرتنی پێ دەدەم.

# ئادابی قورئان خوێندن



١- کاتێ ویستم قورئانی پیرۆز بخوێنم دەست نوێژ دەگرم و زۆر بە ڕێزەوە قورئانەکە دەگرم ڕووەو قیبلە دادەنیشم.

٢- بەدەنگێکی خۆش و لەسەرخۆیی دەیخوێنم و پەلەپەل ناکەم.

٣- لەواتای ئایەتەکان ڕادەمێنم و هەوڵ دەدەم کار بە فەرمانەکانی بکەم و خۆشم لە قەدەغەکراوەکانی بپارێزم.

٤- کاتێ کە قورئانم خوێند تەنها لەبەر خوا دەیخوێنم و لەسەر خوێندنی پارەو کرێ لە هیچ کەسێك داوا ناکەم.

٥- کاتێ گوێم لە قورئانم خوێندن بوو دەنگەدەنگ ناکەم و زۆر بەچاکی گوێی بۆ ڕادەگرم.

٦- ئەگەر لەشم پاك نەبوو یان دەستنوێژم نەبوو ئەوە قورئان هەڵناگرم و دەستی بۆ نابەم.

## ئادابی من لەگەڵ پێغەمبەردا (د.خ)




١- پێغەمبەرم (د.خ) لە خۆم و هاوڕێکانم و هەموو خەلکی زیاتر خۆش دەوێت.

٢- هەموو کات بە خاوەن شکۆ و مەزن دای دەنێم و هەرکاتیش ناوی کەوتە بەر گوێم سلاّواتی لەسەر دەدەم و دەڵێم (دروودی خوای لەسەر بێت).

٣- بە ڕاستگۆترین کەسی دادەنێم و هەموو کات ئەو کارانە دەکەم کە ئەو پێی خۆش بووە و خۆشم دەپارێزم لەو کارانەی کە ئەو پێی ناخۆش بووە.

٤- هەوڵ دەدەم ژیانم بە بێ زیاد و کەم بە سوننەتە شکۆدارەکانی بڕازێنمەوە.

٥- هەوڵ دەدەم بانگەوازی خەڵکی بکەم بۆ ئەو بەها بەرزانەی کە ئەو بانگەوازی بۆ کردوون.

٦- شاهێدی دەدەم کە بە ڕاستی ئەو نێردراووپێغەمبەری خوا بووە، وە شاهێدی دەدەم کە بە ڕاستی بە تەواوی و بێ کەم و کوڕی بە یامی خوای ڕاگەیاند بە خەڵکی.

٧- هەموو ڕۆژێك سەڵاواتی لەسەر دەدەم، چونکە هەر کەسێك یەك سڵاواتی لەسەر بدات خوای گەورە دە سەڵاوات لەسەر ئەو کەسە دەدات.مسلم

٨- هەوڵ دەدەم کاتەکانم بە خوێندنەوەی ژیانی ئەو و فەرموودە شیرینەکانیەوە بەسەر بەرم.

# ئادابی ڕێزگرتن لە دایك و باوك



١- زۆر باش و چاكەكار دەبم لەگەڵیان و دەستەكانیان ماچ دەكەم و هەرگیز دڵیان نائێشێنم.

٢- زۆر ڕێزیان لێ دەگرم و هەردەم لە كاری چاكەدا گوێڕایەڵیان دەبم و پێویستیەكانیان جێبەجێ دەكەم.

٣- هەرگیز دەنگم بەرز ناكەمەوە بەسەریاندا و تۆف و قسەی ناخۆشیش بەرامبەریان نانوێنم.هەموو كات دوعای خێریان بۆ دەكەم و دەڵێم (رب ارحمهما كما ربياني صغيراً) الأسراء.

٤- زۆر ڕێزی خزمەكانی دایك و باوكم دەگرم و هەرگیز بە بێ مۆڵەتی ئەوان بە هیچ لایەكدا ناڕۆم.

## لە کۆتاییدا . . .

- لەخوای گەورە داواکارین بەرەکەت بخاتە ئەم نوسراوانەوەو مندالّی هەموو لایەك صالّح و چاکە خواز بکات.
- داواکارم لە دایك و باوکان ئەم نوسراوانە بۆ جگەرگۆشەکانیان بخوێننەوەو هەڵیان بنێن لەسەر ئەم ئامۆژگاری و ئاکارە جوانانە.
- لەدوعای خێرتان بێ بەشمان مەکەن .

زۆر سوپاسی برای خۆشەویستم کاك(هاوبیر جمال)دەکەم کەلەم ئامیلکەیەدا یارمەتی دام ، خوا پاداشتی باتەوە .

٢٠١١/٣/٢١ والسلام علیکم و رحمة الله

# منداڵان

## وەرن با فێری ئادابە ئیسلامییەکان بین



وەرگێڕانی

زانا کەریم